# حکایتی دز و قاضی




چاپ کرا لە سەر نفقەی محمد أمین عصری خاوەنی کتیبخانەی

ترقی لە کرکوك

 « نرخی پنجا ٥٠ فلسە » ١٣٧٣ هـ ١٩٥٣ م

بسم الله الرحمن الرحيم

أ گیرنەوە کە لە زەمانی هارون الرشیدا لەشاری بغـدا پیاویك بووە زور مسلمان‌و بەدین ناوی بشر ولقبی بشیر بو امری قضاوتی بەراستی وباشی بەجی أهینا وشەو هموشەو بە عبادتی خدا رای أبووارد وهمو روژی بە روژو بو . أهلی بغدا زور اعتقاد ( باوەر ) یان بە تدبیری هەبو . بە عبادت وخدا پرستی بە نوعی خوی رازاندبووەوە کە هیچ کس نەی أتوانی لەقصە کردن برامبەری بکات .

شەویك بە تنیا لە برچرا موتالای حدیثی أ کرد گەیشتە أو حدیثە کە پیغمبر صلی الله تعالی علیـەوسلم فرمویتی ( احب الصلوة في الجنان والبساتین ) یعنی حـەز لە نویژ کردنی ناو باغ

وبیستان أ کەم قاضی أم حدیثەی پی خوش بو لەدل خویا گوتی سبەینی من بەم حدیثە معاملە أ کەم وایتر لەمەو پاش زور جار لەناو باغ نویژ أ کەم . لەپاش أوەی قدری موتالای کرد خەوی هات ویستی کتیبەکە هەل بگری وبخەویت ، لە کتیبەکەدا چاوی بەحدیثی کی تر کەوت نوسرابو (النوم أخ الموت) یعنی خەو برای مردنە . قاضی کەچاوی بەمە کەوت خەوی زرا لەدلی خویا گوتی شتیك کە برامبەری مردن بکات لازمە کەانسان لەو شتەدور بیت . دیسان بەموتالای کتیبەکە مشغول بووە . ژنی قاضی باغیکی کردبو وکو بهشت خوش وپربو لەریحانەوسنبل و ونوشە وگلی رنگاو رەنگ ودرختان میوەدارو سرو صنوبر وشمشاد وچنار وکاج وعود وعوسج بەهرچوار اطرافی أوباغەدا سریان گەیشتبووە کهکشیان فلك ولەهرچوارلاوە آوی وکو کوثر جاری بو کەشاعر لە مدحی أوباغە فرمویتی . شعر :

پربو لە گل و لالەی رنگاو رنگ

پربو لەمیوەی تازەوخوشو جوان

بای نسیم لە سیبەری درختەکانا

دای خستبو فرشی آوریشمی ایران

أو باغه لە دەری شاربو وەمدتی بو قاضی نەچوبووە ناو أو باغه . شەویك لەشەوان قاضی خیالی کرد کەسبەینی روژی جمعەبو بچیت لەناوی أوباغەدا نویژی بیانی بکات وتماشای باغه کەیش بکا . وحدیثه کەی پیغمبر بەجی بینی .

قاضی غلامیکی هەبو ناوی بختیاربو بانـگی کرد گوتی أی بختیار بیانی لەگل فجر هەلسه ، گویدریژه مصری یەکه زین بکه وی هینه بەر دەرگا أمەوی نویژی بیانی لەباغ بکەم غلامەکه عرضی کرد بەسرچاو . لە پاشان غلام رویشت بوایشی خوی وقاضی چووه ژورەوه لەناو جیگادا بە استراحت خەوت .

غلام أو شەوه لەترسی أوەی نەوکو خبری نەبیتەوە درەنگ هەلسی نەخەوت ، چندی لەشەو تیپەری بو نەیزانی چیوەختە وچند لەشەو پریوە گویدریژی مصری ی زین کرد وبردیـه بەر درگای مالی‌قاضی وبانگی کرد گوتی : قوربان هەلسه أوا گویدریژه کەم زین کردەوە لەبەر درگایه . قاضی کەدەنگی غلامي بیست هەلسا نەیزانی چەوەختە تماشای آسمانی کرد له بەرأوه مانگەشەوبو وهای‌زانی روژه جبەی لەبەر کرد مزەری

نایە سەری وپیلاوی کردەپی سواربو لەشاری بغدا رویشتە دەرەوە روی کردە باغ لەسر ریگای باغـــەکەدا قبرستانی هەبو کەقاضی گەیشتە أو قبرستانە قضا وای هینا دزیك لە ناو قبرەکانا خوی مات کردبو ، کەچاوی کەوت




غلام گوی دریژە مصری زین کرد وقاضی سواری بو
بە تنها لە شاری بغدا رویشتە دەرەوە

بـه قاضی وتنیا وبەسواری گویدریژ بەریوه أهات دوعای أخویند . دزەکه شمشیری هەل کیشا وهەلسا سری ریگای گرت وبانگی کرد ( ای قاضی لەجیگای خوت راوسته ) که قاضی چاوی کەوت بـه دزەکه شمشیری بـه دستەوه بو اندامی لرزی و گوتی تو کی یت : دزەکه جوابی دایەوه گوتی ، من دزم قاضی گوتی : تو لەخدا ناترسی دزی أکەیت؟ دزەکه گوتی : ای قاضی لەخدا نەترسامایه بانگم نەأکرد شمشیرم أدا له گردنت . ایستا یا أبی گویدریژ له گل لباسه کانت بدەی بەمن ویاخود أتکوژم . قاضی که أم قصەیەی بیست دوکەل له سەری چووه دەرەوه گوتی أی بی حیا تو هیچ شرم لەمن ناکەی من قاضی مسلمانانم . دزەکه جوابی دایەوه گوتی تو شرم بکه وقصەی بی فائده مکه منیش دزی مسلمانانم . مدەتیکی زوره بەشوین راویکی وهادا أگرام خوای تعالی توفیقی دام واتو لباسی باش وگویدریژەوه بوی بەنصیبی من زو له گویدریژه که دابەزه وروت ببەرەوه هرچی تو هەته مالی منه قاضی سری بەرز کردەوه بو آسمان و گوتی: استغفر الله إلهي تو دانای حالی بندگانی چه گناهیکم هەیه وا

گرفتاری دەستی ئەم دزەت کردم أمجـــا دزەکە گوتی :
لاحول ولا قـوة إلا بالله العلي العظيم . أمـە چی بلاییکە زو
خوی ومنیش رزگار ناکات .

قاضی گوتی بەلەمەکە قصەییکت بی‌ألیم .




دزەکە شمشیری هەل کیشا وگوتی أی قاضی لە جیگای

* خوت راوستە *

دز گوتی : هر قصەییکت هەیە زو بیکە وروت بەرەوە !

قاضی گوتی : ای پیاوی مرد أگرتو دزی نەکەیت رزقت نابی ؟

دزگوتی : أی بی عقل توبوچی قرآنت نەخویندوە خدایتعالی لەقرآندا فرمویتی ( نحن قسمنا بینهم معیشتهم ) یعنی هر عبدیك بەکاریك وپیشەییك رزقمان بوقسمت کردوە قسمتی منیش أمەیە کە تزو لەسر اولاغەکە بینمە خوارەوە وروت بکەمەوە بەسلامتی بروم بوایشي خوم .

قاضی گوتی پیاوی چاك بە وازم لی بهینە بروم عبادت بوخوا بکەم وبەمرادی خوم بگەم دز گوتی : مرادی من لەتو حاصل أبیت چون برەلات بکەم ووازلەقسمتی خوم بهینم .

قاضی گوتی : ای مردی آزا شرم بکە بی مروت مەبە پیغمبرصلی اللہ تعالی علیە وسلم فرمویەتی ( الحیاء شعبة من الایمان ) هرکسی شرمی نەبی ایمانی نیە .

دز گوتی : ای بی‌مروت ای تو بوچی شرم ناکەی وزو روت نابیتەوە جنابی‌قاضی ، أمەیش پیغمبر فرمویەتی کە ألیت ( الحیاء مانع الرزق ) یعنی حیا مانعی رزقە . ایستە زو روت

ببەرەوە وقصە دریژ مەکە

قاضی گوتی : ای جوان میرد ـ خـــدایتعالی فرمویەتی ( السارق والسارقة فاقطعوا ایدیهما) یعنی دزتان کەگرت دەستی ببرن اگر ژن واگر پیاوبی ـ دزی حرامە

دزەکە جـوابی دایەوە گوتی : ای قاضی توش اگر أتوانی وهابکە . لەکتیبدا خویندومە حدیثە : اگر کسی لەبر برسی‌یەتی نزیکی هلاکی بیت چشتی مـردارەوەبو کە حرامە بی‌خـوات دروستە ومالی‌تو لەگوشتی مردارەوەبو کمتر نیـــــە .

قاضی گوتی : هتا کەی وچند وعظت بوبخوینم وجوابم بدەیتەوە .

در گوتی : لازم‌بو تو بەم نیوە شەوە لەمالی‌خوت نەهاتی بایە دەرەوە . کەوابو مالی‌تو هین‌منە أی جنابی قاضی چون أتوانم بەرەلات بکەم کە بەسلامتی بروی . أگرحەز أکەی‌لە دەستمن رزگاربی لباسەکانت وگویدریژەکە تسلیم بەمن بکە بوخوت بەاستراحت برو .

قاضی گوتی : أی مردی آزا شەوملی تیك چو وها حالی‌بوم

که نزیکی روژه ئەم زانی نیوه شەوه .

دز گوتی : جنابی قاضی که وابی تو علمی أستیره نازانی که حەوت أستیره ودوازده برج ونو درجه وشصت دقیقەهەیه منزلی مانگ وجیگای أستیره کان ناناسی بویه بی‌وقت لەمال دەرچوی ودوچاری أم زحمته بویت .

قاضی گوتی : ای جوانمرد پیغمبرصلی الله علیه وسلم فرمویەتی ( من آمن بالنجوم فقد کفر ) یعنی هر کسی ایمان به استیره بکات کافر أبیت دزه که جوابی دایەوه گوتی : أی قاضی أگر تو انکاری أستیره کان بکەیت به تحقیق أبی بەکافری مطلق . چونکه جبرئیل نو آیتی حقی لەبابەت أستیره کانەوه بو پیغمبر هیناوه .

قاضی گوتی : أو نو آیته کامەته ؟

دزه که جوابی دایەوه وگوتی :

( ١ ) یەکەم : انا زینا السماء بزینة الکواکب

( ٢ ) دوهم : ولقد جعلنا في السماء بروجاً .

( ٣ ) سی‌هم : والقمر قدرناه منازل .

( ٤ ) چوارم: والقمر والنجوم مسخرات .

(٥) پنجم : فلا أقسم بمواقع النجوم .

(٦) شەشم : لتعلموا عدد السنين والحساب .

(٧) حەوتم : وبالنجم هم يهتدون .

(٨) هەشتم : والشمس تجرى لمستقر لها .

(٩) نوهم : والسماء ذات البروج .

کەوابو ای جنابی قاضی هر کس انکاری یك حرفی قرآن بکات کافر أبیت أگر تو انکاری ئەم نو آیتـه نا کەیت بوچی انکاری أستیره أ کەیت ؟ ایستا زو لباسەکانت دابکەنه وقصەی زیاد مەکه ، بەسلامتی برو .

قاضی گوتی : ای برای عزیز تو که منجمی‌کی هینده باشی بزانه طالعی من چا که یا خود خرایه ؟

دزه که ووتی : پرسیاریکی زور گران أ کەیت . أگر عاقلی جوابت أمەیه : تو هینده کەری چاوت لەریگایه که چی لەمن أپری . لەگەل أمەدا کەتوشی ئەم بلایه بویت هیشتا لەمن سؤال أگەیت . توبزانه قمر له عقربدایه به دو درجەو سی دقیقەو حەوت ثانیه ومریخ له چوارمدایه لەم وەختەدا دزی ولەریگا خلق روت کردنەوه باشه . فقط

چاك نيه قاضى لەمال خـوى بيتەدەرەوه . ايتر زو لە كوى درێژەكە دابەزه ولباسەكانت دابكەنـه وبى‌يانده بـەمن به سلامەتى برو بوهر لايێك حەز أكەيت .

قاضى گوتى : پياوى چاك به وازم لى‌بهينه بروم حـديثى پيغمبر صلى‌اللّٰه‌عليه‌وسلم بەجى بهێنم كه فرمويەتى : ( حـەز لەنويژ كردن أكەم لەناو باغ و بوستانـدا ) منيش بوأوه هاتوم بچم لەناو باغ نويژ بكەم .

دز گوتى : كەتو بەحـديث ايش أكەيت بوچى لەم حديثه بى خبر بويت كه پيغمبر صلى‌اللّٰه‌عليه‌وسلم فـرمويتى : ( الرفيق ثم الطريق ) يعنى انسان لازمه رفيقى بى بوريگـا أگرتو رفيقى يا غلامي لەگەلتا ببوايه دەسەلاتم بـه سرتا نه أبو وله ژير دستى منا بەم نوعه ذليل وپريشان نه أبويت .

قاضى كه أمەى بيست له دلى‌خـويا وتى : خـــوزگه نختيارى خذمتكارم لەگەل‌خوم هينايه .

أمجا دزەكە وتى : زو دابەزه وروت ببەرەوه بـوكوى أچى برو .

قاضى وتى : اى مردى آزا حضرتى پيغمبر ﷺ فرمويتى

( المسلم من سلم المسلمون عن يده ولسانه ) يعنى مسلمان أوكسه يه كه مسلمانان له دەست وزبانى أمين بن مكر تـو مسلمان نيت كه ناهيلى بچم طاعت وعبادتى خدايتعالى بكەم؟

دزەكه جوابى دايەوه گوتى : تو رشوت ( برتيل ) أونده اخوى كه بغدا ويران نابيت چونكه خوا رحم أكات تو به روژ عالم روت ا كەى منيش به شەو وەها روتت اكەم چونكه مجبورم اى نا قاضى من مسلمانم وايمانم بەقرآن هەيه . وبه حديث معامله أكەم بەلام كچى آموزاييكى خوم مارە كردوه ونەيك دينارم لەدستايه ونەلەمالدا هيچم هيه ودايكى كچەكه داواى لباسى بوكينى لەمن أكات . هتا امشەو پنام برد بوكلامى خدا وتفاؤلم كرد قرآنم كردەوه ام آيتەم بوهات كه افرموى ( ليس للانسان إلا ما سعى ) يعنى هيچ بوانسان نابى بەغيرى سعى كردن . له ايشى كارى دنيـــادا هروكو خدايتعالى وهاى فرمووه لەكتيبى مشارق الانواردا چاوم بەم حديثه كەوتووه كەحضرتى پيغمبر ﷺ فرمويەتى ( تسارقون تغانموا ) وله تختەى رملدا ديتومه كەام سعاته سفر كردن باشه وتماشاى تقويمم كرد مريخ له چوارمدايه

ومشتری له منازل وقمر له عقرب‌دایه دزی وریکا گرتن‌چاکه
درحال سلاحم هه‌لگرت‌و بـودزی له‌مال هاتمه دره‌وه یازده
فرسخ به‌ریدا هاتوم وأبی‌به‌یازده فرسخ أمجا بگـه‌مه‌وه مالی
خوم وچونکه أبم به‌کوخا لازمه لباسی‌تازه واولاغم بیی
اینستا زو له‌گو دریژه که دابه‌زه ولباسه‌کانت دابکه‌نه بیـده
به‌من به‌سلامتی برو روزتر قصه مکه بابه‌تیغی زامدارت‌نه‌که‌م
قاضی گوتی : لا حـــول ولا قوة إلا بالله العظیم مگر تو
دیوی که أونده أذیت وزحمتم اده‌ی .
دزه‌که ووتی : اگر من دیوبم توکافری به‌دلیلی او
آیته‌که خدای‌تعالی له‌قرآندا فرمویتی ( إنـا أرسلنا الشیاطین
علی الکافرین ) یعنی دیومان روانه کرد بوسه‌ر کافران ای
حضرتی‌قاضی له تفسیردا خویندومه‌که زمینی‌شوره له‌حضور
خدایا شکاتی کرد گوتی الهـی ای اوه‌ی کـه پروردگاری
عالمی ورازقی انس‌وجنی ام تالی وشوریه چیـــه له‌منا
خلقت کردوه که‌هیچ کسی نزیکم نا که‌وی وگیا له‌سرمن
ده‌رناچی خوم بی‌به‌شم وکس نفع له‌من نابینی . حضرتی
رب العزة جوابی دایـه‌وه فـرموی بوچی شکات اکه‌ی

لەسرتو شکر واجبە کەتو أو زمینـە نیت خلقت بکەم بییت
بەجیگاو مسکنی قاضی بەکان کەبەسبی شومی اوانەوە بکەویتە
عذابەوە . وەختی زمین امەی بیست نالاندی وگریا عرضی کرد
الهی راضی بوم بە تقدیری ازلی . ای قاضی احوالی تو أمەیە
کەبیستت . چاکترین قصەأویەکە کەم وکـورت بیت .




﴿ ای قاضی زو لە گو دریژەکە دلبەزە با بەتیغی زامدارت نەکەم ﴾

زوبه قصه له حدی بەری

قاضی گوتی ای بیحیا وازبهینه بروم ریگا کەم بردە

دزەکە ووتی : توبه من ألیت بی حیا منچی بەتو بلیم لەو روژەکەوە تو بوی بە قاضی‌ی بغدا همو خلق هاوار أکەن لەبر مکرو حیلەی‌توخلقی پناأبەنە بەر خدای تعالی . زو روت بەرەوە وا وەختی سبەینەیە .

قاضی گوتی : پیاوی چاك بە حورمتم بگرە وبەحدیثی پیغمبر ﷺ معاملەبکە کەفرمویتی ( العلماء ورثـة الأنبياء ) یعنی علما وارثی پیغمبرانن .

دزەکە جوابی دایەوە ووتی : قاضی یەکان علمی عالمانیان نیە . قاضی‌ی ئەم زمانە أگرمردو ببینن کفنەکەی أگرنەوە. ای قاضی أگرتو وارث پیغمبر بیت أمنیش مخصوصی خدام بەدلیلی ام حدیثەی پیغمبر کە فرمویتی ( اهل القرآن اهل الله ) یعنی أو کسانەی قرآن أخوینن خاصەی خدان . من بە حەوت قرائت قرآن اخوینم بەدائمی .

قاضی لی‌ی پرسی او حەوت قرائتە کامەیە . دز ووتی‌یەکەم ئتی‌اقر نافع . دوهم : قرائتی ابن کثیر . سی‌هم : قرائتی ابوعمرو

چوارم : قرائتی ابن عامر . پنجم : قرائتی عاصم . شەشم : قرائتی حمزە . حەوتم : قرائتی کسائی .

قاضی کە أمەی بیست متحیر بو لە دلی خویا گوتی ئـەم دزە چون ئەم عامەی هەیە . لە پاشان گوتی ای مردی آزا تو کە لەقرآن وحدیث آگاداری بوچی ظـلم لەمن أکەی خدای تعالی فرمویتی ( لعنة الله علی القوم الظالمین ) لعنتی لە ظالمان کردوە . دزەکە گوتی : توظالمی کە شەو بـە تنیـا وبی رفیق لەمال هاتویە دەرەوە لعنتی خدا بەرتو أکەوی. ایستا زو گویدریژ ولباست همو تسلیم بکە . بچـو بو جهنم

قصەکردن لە أندازە تی پەرری ، سەرمانمە پیشینە .

قاضی ووتی : ای مفسد وازم لی بهینە ریگام بەرەلا بکە وبرو . دزەکە گوتی : بەمن ألیت مفسد ؟ أحـا لە سەرم واجب بو لەسەر گویدریژەکە بتخەمە خوارەوە ولباسەکانت دابکەنم روتت بکەمەوە چونکە ایشی مفسد چاك نابی چونکە خدا فرمویتی (ان الله لا یصلح عمـل المفسدین ) یعنی ایشی مفسدان چاك نابیت . چـونکە بەمن ألیت مفسد لازم بو

سرم وەکو سیر روتت بکەمەوە گویدریژ ولباست هرچی
ئەیە بی بەم .

قاضی ووتی : ای دز خدای تعالی دەرنگك انسان
گری فقط گران أیگری وەکو فرمویتی ( ان بطش
ربك لشدید ) تو بترسە روژی گرفتار ئەبی .

دز گوتی : راستە خدا مهلتی دابەتو هتا . امشەو گرفتار
بویت بەدستی من ولە قاضی یەتی توبە بکەیت وا ایستاحکم
توی گرت چونکە خەلك لە دستی تو همو هاوار أکەن
ولە تاو قاضیەتی تو روحیان دەر أچیت وبە گریانەوە مردنی
تو لەخدا طلب أکەن . ایستا زوبە نزیکی بیانی‌یە .

قاضی ووتی : پیاوی چاك بە پیغمبر فرمویەتی ( ارحم ترحم )
یعنی رحم بکە حتی رحمت پی بکەن .

دز ووتی : اگر من رحم بەتو بکەم خدا رحم بەمن
ناکات چونکە پیغمبر ﷺ فرمویتی ( من أعان ظالماً فسلطه
الله علیه ) یعنی هر کسی یاریدەی ظالم بدات خدا أو ظالمه
مسلط أکات بەسریا تو ظالمی بەسەر نفسی خوت ورحمت
نیە بە کس .

قاضی گوتی: ای جوان مرد تو بەم آیتە معاملە بکە کە خدا فرموێتی ( والذین اوتو العلم درجات ) یعنی علما درجەی بەرزە تو وەکو منی ومنیش وەکو توم - ومشهورە ( الجنس مع الجنس یمیل ) هموکسی وهمو شتی میلی لە گل هاوجنسی خویا هەیـــــە .

دزەکە گوتی : جنابی قاضی من لە گل تودا هیچ مناسبتم نیە تو قاضی وامام شاری بغدای صاحب رتبەو مال وجاهی : رشوتو مالی هەتیوان ووقف أخوی . دو کس بوشکات بینەلات لە هریەکی لەو دو کسە نیوەی حقەکەیان أبری . من پیاویکم بی مالو حالو سرگردان بەدست جەوری چرخـەوە گیرودە بووم . زوبە روت ببەزەوە درەنـگە ...

قاضی گوتی : ای جوان هیچ وەختی بی‌عقل مقابلی عاقل نابی خدا فرموێتی ( الذین یعلمـون والذین لا یعلمون . )

دز ووتی : ای قاضی توعاقلی ومن بی‌عقلم چونـکە پانزدە فرسخ ریگا بە هزار مشقت هاتوم کە مقصودم لەتو حاصل بی وحتی مقصودم حاصل نەبی ناچمە دوواوە توبی‌عقلی کە أم نیوە شەوت بە روژ زانیوە بە جاهلی وبی‌عقلی بوی بە

قاضی . خدای تعالی به حکمو قراری تو نابی راضی علمه کەت بوتو له ضرر زیاتر هیچ قازانجی نیه اگر تو عالمی بوچی بەم حدیثه معاملەت نەکرد که فرمویتی ( انما الأعمال بالنیات ) ایتر زو تسلیم ببه

قاضی ووتی : ای جوانمرد هیچ عبادت بوخدا أکەیت ؟

دز گوتی : چون عبادت بوخوا نەکەم کەبەم نیوەشەوه توی له شیرین خەو جیا کردوەتەوه وناردوتی بومن رنج بەخسار نەبوم ایتر قصه کردن بەسه روت ببەرەوه .

قاضی امجا گوتی : أی مردی آزا توکه أونده له حدیث آگاهداری نازانی حدیثی پیغمبره که أفرموی ( اتقوا دعوة المظلومین فانه مقرون بالاجابة وان کان کافراً ) یعنی بترسه له دوعای مظلومان چونکه زو قبول أبیت . أگرچه أو مظلومه کافر بیت .

دز ووتی : ای قاضی له حدیثدایه که دعای چوار کس مقبول أبیت یکەم دعای رعیت له حق پادشاه دوهم دوعای شیخو ملموستا لەحق مریدان وشاگردان ، سیهم دوعای باوکو دایك لەحق أولاد چوارم دوعای غریبان له حق

دراوسی‌یان . ای قاضی راست بلی‌لەم چوار دوعایە دوعای کامیان لەتو کاری کردوە وچی‌نوعیك ظلمیکت کردوە کەلەجزای أو ظلمەدا امشەو بدستی‌من گرفتار بوی . ایستا زو دابەزە ولباسەکانت دابکەنە بو هر جیگای أچی بچو وقصە درێژ مەکەرەوە .

قاضی ووتی : أی جوان وازم لی بهینە أگر خرابەم لەحق بکەی توش دوچاری خرابە أبی . أوسا کەپشمان بویت فائدەی نیە نازانی کسی خرابە لەحق یکی بکات أو کەسە دوچاری خرابە أبی .

دز ووتی : أی قاضی أم نصیحتو قصەو وعظەی تو بی‌فائدەیە تقدیر وها بووە کە امشەو من تو روت بکەمەوە غیری أمە کەروت بیتەوە هیچ چارەوعلاجت نیە .

قاضی گوتی : ای جوان‌مرد خدایتعالی قدرتی هیە کەتو بیهینیتە سەر ریگای راست ووازم لی بهینی لە قرآندا فرمویەتی (یمحوالله ما یشاء ویثبت وعنده أم الکتاب ) یعنی خدایتعالی قدرتی هەیە حکمی کە کردویەتی محوی بکاتەوە وبە نوعیکی تری بگیری .

دز گوتی : بلی راسته أما حضرتی پیغمبر فرمویتی (من قلم بما هو كائن بینا ) یعنی أوەی کەقلم لە روژی أول دا نوسیویەتی نا گورری. ایتر زیاتر قصه مه کە لە گویدریژه کە دابەزه خوت روت بکه رەوه وبەدستی مبارکی خوت لباسه کانت بده بەمن وبرو أوا نەزیکی بیانی‌یه

قاضی گوتی : ای جوان مرد أم کارەی‌تو بی‌برکته .

دز گوتی : وەختی برکتی نابی کـه بەاسراف خرجی بکەم من هرچی کەدەستم بکەوی بە قدر احتیاجی خوم صرفی أکـەم بو أوەی برەکتی باقی بی .

قاضی گوتی : باشه تو هر چیم هەیه لیم أستینی منیش رجات لی ئەکەم لطف بکه لە گەل من وەره هتا بەر درگای باغه‌کە لەوی أمجا دا أبەزم بە رضای خوم گویدریژ ولباسەکەم تسلیمت أکـەم .

دزه‌کە گوتی : ای قاضی أتەوی بەفیل‌و حیله بمبـەینه بەر قاپی باغه‌کە هاوار بکەیت باغەوانه‌کە بیت بمگـری ویاخود أوسا من لەترسا فراربکەم ولەچنـگی‌من رزگار بی من لە گەل تو چون دیم . زو روت بەرەوه من لە تو

زور زانـــــترم .

قاضی گوتی : عهد بی سویندت بو أخوم له نزیکی باغه که دابه‌زم وروت ببه‌مه‌وه وهیچ هاوار نه‌که‌م گویدریژو لباسه کانم پیت بده‌م .

دز ووتی : ای قاضی خدای تعالی له قرآندا فرمویه‌تی (ولا تلقوا بأيديكم الى التهلكة) یعنی به‌ده‌ستی خوتان مکه‌ونه هلاکه‌ته‌وه . من له گل تو که‌هاتم له‌به‌ر درگای باغه که باغه‌وانه کان خبردار ابن وهمویان یاریده‌ت أده‌ن وأمگرن وگوریسی أخه‌نه گردنم وبه ناو شاری بغدا أمگیرن وامخه‌نه زندانه‌وه . خریکی گرفتاری أم دردم بکه‌ی ؟ أم قصانه فائده‌ی نیه . چاره‌ت أوه‌یه زو گویدریژو لباسه‌کانت بده‌ی به‌من ایتر قصه نه‌که‌ی بوخوت بروی .

قاضی که‌أم قصانه‌ی له دز بیست زور داما وومتحیر بـو جوابی نه‌دایه‌وه سه‌ری شور کرد وفکری کرده‌وه .

دزه که تماشای کرد قاضی مات بووه وقصه نا کا ، چووه پیشه‌وه قاضی‌ی له سه‌ر گویدریژه‌که دا گرت وکلاوو میزه‌ره که‌ی له سه‌ر دا که‌ند وپی گوت : قاضی زو به‌ده‌ستی

خوت لباسەكانت دابكەنە وبیدە بەمن .

أمجا قاضی ناعلاج لباسەكانی دا كەند ودای بە دزەكە تنها كراسو دەرپی كەی لەبردا مایەوە . دزەكە بە قاضیی گوت لە ابن عباس أیگیرنەوە كەپیغمبر ﷺ فرمویتی ( القمیصین القمیص لیس لە حلاوة الایمان ) یعنی صاحبی دوكراس شیرینی ایمانی نیە كەوابو ای قاضی تو لەمالەوە چندقات لباسی ترت هیە؟ زو كراسو دەرپی كەیشت دابكەنە وبیدە بەمن لازمە .

قاضی گوتی : ای بی انصاف روتم مكەرەوە من نویژ اكەم .

دز گوتی ای قاضی ( رسول ﷺ ) فرمویتی ( صلوةالعریان جائز ) یعنی بەروتی نویژ كردن دروستە .

قاضی ناچاربو كراسەكەی دا كەند ودای بە دزەكە .

دزەكە گوتی : ای قاصی زو درپی كەش دابكەنە بمدەری هتا بەم شیرە زامار نەبویت .

قاضی ووتی : ای بی انصاف عیبم دەر مەخە دەرپی كەم لی مەستینە .

دز ووتی : ای قاضی بوچی تو أو مسئله‌یه‌ت نه‌بیستووه

که حکیمی شه‌و خبریان دایی گوتیان دوینی‌شه‌و دز چووته



دزه‌که قاضی‌ی له گویدریژ داگرت وکلاوو میزه‌ره‌که‌ی له سه‌ر داکه‌ند

مالی ایوه . حکیمه‌که گوتی · خدایا أو دزه کویخـــا مال

نه‌بوبی گوتیان ای حکیم چون أبی به‌کویخا . حکیم گوتی

أگر کویخا بوبی کسکی له ماله‌که أدا أمجا ای قاضی من

أول جار عرضی توم کرد أبم به کویخا که‌مو زور هرچیت

هەیە هینی منە . دربی کەشت دابکە قاضی . هتا کو ببم
من لەتو راضی ای جنابی قاضی درنگە زو دای بکەنە .

قاضی ایتر ناعـــــلاج دربی کەی دا کەند ودای بە دزەکە
لە پاشان دزەکە چاوی بە بی‌لاوەکانی قاضی کەوت درەنگە
کەوشەکانیشت دا بکەنەلەم قصانەدابون دزەکە چاوی بە
أنگوستیلە ییك کەوت لەدستی قاضی‌دابو گوتی ای‌قاضی چە
مذهبیکت هەیە ؟ قاضی گوتی : لە سر مذهبی شافعیم .

دزەکە ووتی : بویە أنگوستیلەکەت کردو وەتە دستی
چەپ . دای‌بکەنە بیدە بەمن بیکەمە دستی راستم چونکەمن
دوزدە مذهبم هەیە . أم یادگاری‌تو لە دستمدا بیت‌وهیچ
وەختی لە فکرم ناچیت . وتوش چاوت لە هرکسی ببی
أنگوستیلەی لە دەستا هەبی من أ کەومە فکرت .

قاضی ناچار أموستیلەکەی دا کەند دایە دستی دز و گوتی
(أنت المفسر وأنت المخبر وأنت المنجم وأنت المهندس وأنت
العالم وأنت الواعظ وأنت الساحر وأنت الحافظ وأنت الشاعر
وأنت الشجاع وأنت المبارز وأنت السارق لا بارك الله عليك)
یعنی خدایتعالی رحمت پی نە کات ومبارکت نەبی چونکا

رحمت بەمن نەکرد . خلاصە قاضی بەروتی وبی خاوسی بەدلیکی پر دردەوە روی کردە دزەکە گوتی : چونکە أمانەت گشت لەمنت سەند یاخوا بی برکت بیت .

دزەکە گوتی : یعنی لە شەصت گەز میزەری تو یك کراسی منی تیا نابیت . أمەی گوت ولباسەکانی قاضی لەبەر کرد وسواری گویدریژەکەبو آوزەنگی لی‌دا هینایە رقص



دزەکە قاضی‌ی روت کرد وگەلەو گونی وەك کولەگە دەر کەوت

وسما وگوتی : ای قاضی مالی تو حلالە وچونکە کەوتوتە

ـستی‌من حلال‌تر أبیت . دیسان روژیك أبی بەچاو
پی کەوتنی تو مشرف‌بم . حال حاضر بە دوعا .
قاضی گوتی ( لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم ) أمجا
قاضی گەررایەوە بو مالی خوی وەختی رویشتەوە ژنو مالی
وپیاوەکانی چـاویان پی کەوت روت‌و قـوت‌و بی خاوسە



قاضی وها روت قوت گەلەگ‌ن ودەر پیخاوس
گەیشتە مالەوە ژن ومندالەکانی زور ترسایان
وغمبار بون وگیرستن

وعاجزو غمباره نه گویدریژ ونه لباسی و و کراسی ودەرپی وعصاو کەوشی هەیە تعجبیان کرد چون لباس و میزەرو اسبابیان هینا له بەریان کرد وله ناو شاری بغدا دەنگ بلاو بووەوه کـه شەو له ریگای باغ دزیك قاضی ی روت کردوەتـەوه پیاوه گەورەکان واشراف همو چون بو دیدەنی قاضی ، قاضی سر گـذشتەی، خوی ودزەکه به تـەواوی بوی گیرانەوه لەوشارەدا شاعریك هەبو کەأم خـبرەی دزوقاضی بیسـب احوالی أوانی کردبو به شعر گوتبوی :

هاته سر ریگام دزیکی بی پیر عاقلو زیرەك عالمو زور ژیر
گویدریژه کەولباسی لیم سەند دلیلی پیم گوت آزانەو خبیر
شمشیری تیژی به دستەوەبو زبانی تیژتر له همـو شمشیر

تصادف له مجلس قاضیدا أم شعرانەیان أخوینـدەوه وقاضی باسی دزەکەی وقصەکانی أکرد .

قاضی غلامیکی هەبو چوبو درەوه پیاویکی دی جلوبەرگی قاضی ی له بەر کردوه وسواری گویـدریژەکەیشی بووه ولەبەر درگا راوستاوه غلام چاوی بەم پیاوه کەوت زوترسا چونـکه زور سامداربو زو چووه مالەوه وگـوتی جنـابی

قاضی پیاویك وا لەبەر قاپێ سواری گوی دریژه کەی تویه ولباسەکانی توی لە بردایه وکتیبیکی بە دستەوەیه ألیت ایشم بە قاضی هەیه . قاضی کە أمەی بیست گوتی یا خـــوا بو ایمه خیر بی وبو دژمنان شر بی . زو درگای حـەوشه محکم داخەن ومەهیلن بیتە ژورەوە کتیبی نەبو هرچیم هەبو بە آیتو حــــدیث لەمنی سەند ایستا کتیبی هینـاوە أبی چی بکات . کە قاضی أم قصانەی کرد لەنا کامەوە دزه کەهاتە ژورەوە بی سلام کردن چولەلای سەروی قاضییەوە دانیشت

قاضی گوتی : اي بی أدب بەبی رخصت بو چی هاتویه مالی ایمه ولەبرچی سلام نا کەیت ؟ نازانی من قاضی شاری بغدادم وچوت لە ژور منەوە دانشتی .

دزه کە گوتی ای قاضی سلام لەسی جیگا أکری :أول لە ترس و خوف دا : من لەتو هیچ ترس و خوفم نیه . دوهم : بو طمع .. من هیچ طمعم بەتو نیه ورپاییت نا کەم . سیهم : قاضی اسلام نیه وتو دوری لە مسلمانی وەکو شاعر ألیت .

دردت گرانەنا گات بەدرمان عمرت تی بەرری نەگەییەسامان بوی بە امام وپیشەواو قاضی بوچی هرنەبوی تو بە مسلمان

قاضی جوابی دایەوە گوتی : من خوم بەمسلمان ازانم ومعاشم حلالە دزەکە گوتی : ایوە رشوت وسود أخـون وکردەوەی باشتان أمەیە هرلایی گویدریژیك مردار بیتەوە ألین أمـە بو دعا گـویان جائزە. قاضی لەم قصەیە رنگی تیك چو وزور ترسا گوتی :

ای شیخی گەورە بەخیرهاتی سرچاو لە کویەوە تشریف




❁ دزەکە هاتە بومالی قاضی ورویشت لە ژور گشتیان دانشت وسند ❁

❁ نویسی لە سر هزار دینار ❁

هاتوه ایشت‌چیه ؟

دزه‌که گوتی : تو له‌وانه مپرسه ، به‌لام امرو تماشای أم کتیبه‌م أکرد له‌حاشیه‌ی أم کتیبه‌دا چاوم پی که‌وت نوسرا بو که‌تو . کوری خذمتکاریکی منی .

قاضی گوت به چی أمه اثبات أکه‌ی .

دزه که گوتی : روایت أکات له باوکی‌من وباوکم له باپیرم پشتویه‌تی وراسته له زمانی پیشودا که با پیری باپرت خذمتکاری خانه‌زادی ایمه بون . قاضی که بیستی ناوی باوکو باپیری بیان کرد زور ترسا وره‌نگی سپی بو وکو داری بی له‌رزی وگوتی : ای شیخ فاضل مرادو مقصودی توچی‌یه ؟

دزه‌که گوتی : مقصودی‌من أمه‌یه که به‌دلیلی حدیثی پیغمبر بتکه‌م به بنده‌ی‌خوم وأم مقام قاضی‌یه‌تی‌یه له تو بستینم وهرچی له‌ژیر دستی تودایه لیت وه‌ر بگرم ، وأولاده‌کانت همو بفروشم وقیمته‌که‌یان وه‌ربگرم گذرانی پی بکه‌م .

قاضی له دلی‌خویا گوتی واویلا أمه چی مصیبتی بو توشی‌بوم چون أم بلایه دفع بکه‌م أمجا قاضی زور گریا

وله دزه‌كه پاررايه‌وه گوتی يا شيخ رجايه له‌م شاره‌دا رسوا وبدناوم مه‌كه . داوا وطلبی هرچی أ كه‌يت بفرمو به‌روح منت پاره أتده‌می .

دزه‌كه گوتی : ای قاضی قصريكم كريوه به هزار دينار وله‌م پاره‌يه يكدينارم بيع داوه نوصدو نه‌ودو نودينـاری له سرم ماوه أم پاره‌يه‌م له‌تو أوی بده‌ری .

قاضی گوتی : ياشيخ زور باشه ايسته به‌ده‌ستی مبارکی خوت سندی بينوسه صلح بكه‌ين من أو پاره‌ی قصره أده‌م به‌تو . دزه‌كه دستی دايه قلم وكاغـذ به‌دستی‌خـوی سندی صلحی‌نوسی گه‌وره‌كانی شار وعالمان همـو بون به‌شاهـد موريان كرد كه له‌وه‌پاش ايتر هيچ ادعاييك له قاضی نه‌كات أمجا قاضی ناعلاج بو أومقداره پاره‌يه‌ی تسليم به دزه‌كـه كرد وگوتی ای جوان له‌خدا بترسه من طاقتی أوه‌م نيـه همو روژی أذيت وآزارم بده‌يت دزه‌كه قبولی‌كرد هه‌لسا بروات . قاضی به‌ژنه‌كه‌ی خوی گوت لازمه نان‌وطعام ده‌رخواردی أم دزه بده‌ين هتا له‌مه‌ولا نانو نمـكی ايمه‌ی له‌به‌ر چاو بيت ، وايتر رحمان به‌دات ژنه‌كه گوتی باشه ناردی

مریشکیان بوسور کرد له گل طعامی خوش ... قاضی گوتی یا شیخ له رفیقی کردنی تو علم ودینی من زیاد أبیت حەز أکەم صبرکەی بە دلیکی آسودە بەیکەوە نان بخوین

دزەکە عرض قاضی کرد زور بەجی یە انتظاریان کردژنی قاضی چووە لایان سفرەی داخست بریانی مریشك وطعامی خوش بویان دانا . قاضی لەدلی خویا گوتی وا باشە بەدزەکە بلیم مریشکەکە تو بەش بکە أگر موافق بەشی نە کرد تەریقی بکەمەوە . بە دزەکەی گوت یا شیخ حقی تویە بەشی بکەیت . دزەکە دستی دریژ کرد مریشکەکەی پارچە کرد سرەکەی لەبردەمی قاضی دانا وملەقوتەکەی دا بە ژنی قاضی وهردو بالەکەی دا بە دو کوررەکەی قاضی باقی یەکەی لەبردەمی خویا دانا گوتی بسم الله : بخون . قاضی گوتی ای غدار من گوتم وەکو یەك بەحقانیت بەشی بکە أمە چون بەش کردنیکە کردت ؟

دزەکە گوتی : لە پیشا سەرەکەی بوتو دام‌نا چونکە تو گەورە وسرداریت . وملە قوتەکەی دام بەژنەکەت چونکە أو بەتو نزیکترە . وهردو بالەکەی دام بەدو

کورەکەت چونکە دو قول‌و بالی تون وباقی یەکە بوخوم




بەش کردنی دزەکە گوشتی مریشك بە حقانیت لە سەر

سفرەی طعامی قاضی

چونکە میوانم قاضی متحیر وسرسام‌بو جوابی نەدایەوە

دستیان کرد بەنان خواردن کە لی‌بونەوە قاضی بە دزەکەی

گـوت : یاشیخ دوعامان بوبکە دزەکە دەستی بەرز کرد وگوتی یاخدا خانوییکی ترم کریوە بەچل آلتون نیوآلتونم داوە سیونو آلتون ونیوی لە سەرم ماوە قاضی أم پارەیەشم بداتی و کچەکەی بەمن نکاح بـکات لەو خانوە دابنیشین هتا من وقاضی بیئمان چاك بی . أجـا دزەکە دستی هینا بە سەرو روی خویا گوتی آمین .

قاضی ووتی : لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظیم . ایتر تو مقصودت چی‌یە ؟

دزەکە گوتی مقصودم أمەیە کەبیستت

قاضی ووتی : تو چشتیك هەیە بیکـە . لەمالەوە حـەوت هیلـکە مریشکان هەیە وایمە پینج کەسین أگر توأم هیلـکانـە بەبی شکاندن بە ایمـە بەشت کرد هـەرچیت أوی پیت ئەدەم .

ناردی هیلـکەکانیان هینا دزەکە زور فـکـری کردەوە نەی‌زانی‌چون بەشی بکات معطل بو بەهیچ نوعی عقلی نەی‌برری .

أعجا ژنی قاضی چوە پیشەوە گوتی بوچی بەشی ناکەی؟

دزەکە گوتی : من نازانم چون بەشی بکەم . معطل‌ماوم

ژنی قاضی جوابی دایەوە گوتی : وا اقرارت کرد نازانی بەشی بکەی تو شرط بکە هرچی لە قاضیت سندووە بیدەیتەوە من أم هیلکانە وکویك لی‌تان بەشی بکەم وبی‌شکاندن .

دزەکە فکری کردەوە لە دلی خویا گوتی : من بەم همو عقل وتدبیر وحیلەیەوە نەم‌توانی بەشی بکەم أم ژنە چون أتوانی بەشی بکات . دزەکە راضی‌بو ورویشت همو لباس واشیای قاضی لەگل گویدریژە مصرییەکە هینای وپارەکەیشی کەلەقاضی سندبوی دای‌نا ودایانا دست پیاویك بەشرطی‌أوە أگر ژنی‌قاضی هیلکەکانی وەکویك بەبی شکاندن لی‌بەش کردن أم پارە واشیا وگویدریژەی تسلیم بەژنی قاضی بکات وأگر نەی‌توانی بەشی بکات گویدریژو واشیا وپارکە بوذر بیدت وکچی قاضیش بەدزەکە نکاح بکەن بیجگە لەمانە پنجا آلتونی سور دیسان قاضی بەدزەکە بدات وها شرطیان کرد هردو طرف قبولی کرد .

أمجـــا ژنی قاضی هیلکەکانی هل گرت یك هیلکەی دا بەدزەکە ویك هیلکەی دا بەقاضی وبەهردو کورەکەی یکی یك هیلکەی دا وسی هیلکەی بوخـــوی دانا وگوتی

( بسم‌الله ) بی‌خون .

دزه‌که گوتی : ای ضعیفه بوچی به‌راستی وه‌کو یك به‌شت نه‌کرد .




به‌ش کردنی ژنی قاضی ( هیلکه‌کان ) وه‌کو یك و بی شکاندن

ژنی قاضی گوتی : من به‌راستی وحقانیت به‌شم کردوه وهمو پیاویکی عاقل وزیره‌ك په‌سه‌ندی أکات . ایوه پیاوز

هریەکی دوهیلکەی گونتان هیە لەگل أم یك هیلکەیە أبی بەسی هیلکە ومن ژنم هیچم نیە سی هیلکەم وخوم دانا کەأمە راستە وەکویك مساوی بوین .

دزەکە ایتر هیچ قصەی پی نەکرا هناسەییکی ساردی هل کیشا گویدریژ واشیا ولباس وپارەکەی همو تسلیمی ژنی قاضی کرد وزور سویندی خوارد ولعنتی لەخوی کرد کەهتا ماوەلەگل ژنان صحبت نەکات . وهەتا لە (دنیا) دابو کەچاوی بەژن أکەوت وەر آچەرخاند وسەیری ژنانی نەأکرد ... ورویشت لەمزگەوتیکا بو بەمجەور حتی آخر عمری خذمتی مزگەوتی کرد ...



بەعنایتی خوا أم حکایەتە شیرینە تەواو بو

# بو آگاهداری

٤٠

بەم زووانە حکایتی وگالتەگەبی ملای مشهور دەر ئەچی زور خوشە وگشت حکایەتەکانی هر پی کەنینە . مطالعە کردنی أم کتیبە شیرینە بەهمو خویندەوارانی کورد زبان توصیە أکەین وهشتا رسمی نایابی تیدایە نرخی ( سیصد فلسە ) أمانەش لە ژیر چاپە :

# سەرگذشتەی کوررە کەچەل

ئەم حکایەتە سەرگذشتی کوررە کچەلیکی شوانە . ناوی بەحسنە کچەل مشهورە لە حیاتی خوی چی ی بەسەر هاتووە وچی کردووە ، وزور قصەی عجیب وعنتیکەی هەیە هرکسی بیخونیتەوە لە پی کەنین خوی نا گری بەم زووانە دەر أچی وبە همو خویندەواری لازم ئەبی انتظاری بکەن

## حکایتی پشیلە ومشك

أم حکایەتە خوشە بەنظم کراوتە کوردی . لە ناوی رسمیکی رەنگدار هەیە وزور عبرت آمیزە . بە همە خویندەوارانی توصیەی أکەین .